# بوونی خوا

ئایا خودا بوونی هەیە ؟

ئەی بۆ نابینم ؟

ئەی کێ ئەوی دروستکرد ؟

ئەم جیهانە ئەزەلییە ؟

چەند پرسێکی تر..... ؟

ئامادەکردنی

محمد نجات

# پێشەکی

بەناوی خودای بەرز و بێ هاوتا ، و درووود و سڵاویش بۆ پێشەوا و سەروەرمان محمد ( ﷺ ) و شوێنکەوتووانی هەتا ڕۆژی دوایی ، زۆربوونی ئەو ماڵپەڕە ئەلیکترۆنیانە و بڵاویان لەناو گەنجانی موسڵمان و دروست کردنی گومان و شوبهە بۆیان دەربارەی ئیسلام ، بووەتە هۆی ئەوەی کە گەنجە جوان و دڵ سافەکان بخەڵەتینن و فکرەیان بگۆڕن بەرەو فکرەیەک ، کە ماوەیەکی زۆر لەمەو پێش لەلایەن زاناکانی خۆیانەوە پوچەڵکراوەتەوە و هیچ ئەهەمیەتێکی نەماوە ، بەڵام ئیستا بە بەکارهێنانی ئەو ماڵپەڕ و سایتە ئەلیکترۆنیانە دەیانەوێت دووبارە ئەم گومانە نابەجێیانە زیندوو بکەنەوە ، منیش بە گرنگم زانی کە چەند

ئامۆژگاری و بیرخستنەوەیەک بدەمە هاوڕێ و گەنجە دڵ سافەکان بۆ ئەوەی کە بەو قسە نابەجێیانەی ئەوان هەڵ نەخەڵەتێن ، ئەو گومانانەش سەردەمانێک و ئێستاشی پێوەبێت کە مرۆڤ گەڵێک بەدەستیەوە گیریان خواردووە و پرسیاری لەبارەوە دەکەن ، ئەویش بوونی خودایە ، و سەلماندنیەتی ، هیوادارم کە بتوانم چەند بەڵگەیەکی ڕازیکار بدەم بەدەستی جەنابتانەوە ، و بتوانن پارێزگاری لەو فکرە جوان و ڕاستە بکەن کە ئیسلام پێی گەیاندوون ، وە داوا لە خودای گەورە و باڵادەستیش دەکەم کە کۆمەکیمان بکات بۆ ئەوەی کە ڕاستە و دوورمان بخاتەوە لە شوبهە و گومانی خراپ ، بە تایبەت شوبهە و گومانەکە لە بارەی زاتی خۆیەوە بێت .

محمد نجات لە ( ٢١ / ١٠ / ٢٠١٦ ) دا

## پرسیار و گومانەکانیان

ئەگەر تەماشایەکی وردی قورئانی پیرۆز بکەین و لێی بکۆڵینەوە ، بۆمان دەردەکەوێت کە هیچ گەل و نەتەوەیەک نەبووە لەم سەر زەویەدا ( لە گەلانی پێشوو ) کە باوەڕیان بە بوونی خوای پەروەردگار نەبووبێت ، بەڵام ئەوان دەهاتن شەریکیان بۆ بڕیار دەدا و لەگەڵ ئەمدا پەرستراوی تریان دەپەرست ، بە هیوای ئەوەی کە لەو خودایەیان نزیک بخاتەوە کە ئەمان دەست و دەنگیان پێی ناگات ( بە بڕوای خۆیان ) جا قورئانی پیرۆز کۆمەڵە ئایەتێکی ڕوون و ئاشکرای تێدایە کە ئەمە بسەلمێنێت بۆ نموونە :

( وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّموَاتِ وَالأَرْضَ وَسَخَرَ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللّٰهُ فأَنَّ يُؤْفَكُونَ (٦١) -- العنكبوت )

واتە : ئەگەر لێیان بپرسیت کێ ئاسمان و زەوی دروست کردووە و خۆر و مانگی بۆ ڕامکردوون ، ئەوا دەڵێن ( اللّٰه )

ئەی بۆچی لە پەرستنی خودا لادەدەن و ڕوو لە شوێنیتر دەکەن ( بۆ هاوارکردن و پەرستنی غەیری خودا ) .

وە هەروەها لە ئایەتێکی تردا خوای پەروەردگار دەفەرمووێت ( وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَايَعْلَمُونَ (٢٥) -- لقمان )

واتە : ئەگەر لێیان بپرسیت کێ ئاسمان و زەوی دروست کردووە لە وەڵامدا دەڵێن ئەوە ( الله ) یە ، دە پێیان بڵێ سوپاسی خوا بکەن ، بەڵام زۆربەیان نازانن .

دیسان لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت ( وَلَئِنْ سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللهُ فَأَنَّ يُؤفَكُونَ (٨٧) -- الزخرف )

واتە : ئەگەر لێیان بپرسیت کێ دروستی کردوون لە وەڵامدا دەڵێن ( الله ) ، ئەی بۆچی لە پەرستنی خودا لادەدەن و ڕوو لە شوێنیتر دەکەن ( بۆ هاوارکردن و پەرستنی غەیری خودا ) .

لەم ئایەتانە و چەندان ئایەتی تری لەم شێوە دەیسەلمێنێت کە میللەتانی پێشوو گومانیان لە بوونی زاتی ( الله ) نەبووە ، بەڵکو هەروەک باسمان کرد بۆ نزیک بوونەوە لە خودا ، هەندێک پەیکەریان تاشیبوو و کردبوویان بە شەریکی خودا یان خۆر و مانگیان کردبووە شەریکی خودا .

بەڵام پاش ئەوە و لەم سەردەمانەی کۆتاییدا هەستان و دەستیان کرد بە دروست کردنی شوبهە و گومان لەسەر بوونی زاتی ( الله ) و چەندین قسەی نابەجێ و بێ بنەمایان دەهێنا و دەبرد بۆ لە خشتە بردنی گەنجان و لاوانی ئیماندار و ئینکاری بوونی خودایان دەکرد و باوەڕیان بە خودا نەبوو ، و دەیان وت :

**یەکەم** : هیچ کەس و زاتێک نیە ، کە ئەم جیهانەی دروست کردبێت ، بەڵکو ئەم جیهانە لەخۆوە دروست بووە یان هەر هەبووە و هەر دەمێنێت .

**دووەم** : مادەم ئێمە خودا نابینین ، بۆیە بوونی نیە .

**سێیەم** : دەی وا باوەڕیشمان کرد کە خودایەک هەیە و ئێمە و ئەم جیهانەشی دروست کردوە ، ئەی خۆی کێ دروستی کردووە .

وە چەندین پرسیاریتر کە دەیانکرد و دەیان وروژاند ، لە پێناو گۆڕینی فکری گەنج و لاوە خوێن گەرمەکان ، وە بەم بۆنەیەوە وا هەست دەکەم کە گەنجان و لاوانیش بەبۆنەی ئاگادارنەبوونیان لە کۆمەڵێک لە مەسائیلەکان ، بۆیە کەوتوونەتە ناو گومان و شوبهەی ئەوانەوە ، ئێستاش هەوڵ دەدەین بە پێی توانا وەڵامی پرسیارەکان بدەینەوە و داوا لە خوداش دەکەم کە ڕێنمایمان بکات .

## پرسیاری یەکەم

**هیچ کەس و زاتێک نیە کە ئەم جیهانەی دروست کردبێت ، بەڵکو بە سوتفە دروست بووە و خوایەک بوونی نیە کە ئەم جیهانەی دروست کردبێت ، چۆن دەیسەلمێنیت کە خوا بوونی هەیە ؟**

هەموو دونیا بێنی و تۆپێکت پێببێت و ئەم وتەیان پێ بڵێیت کە ئەم تۆپە لە خۆوە دروست بووە ، قەناعەتت هەیە کە تەنها یەک کەسیشیان باوەڕت پێ بکات ، یان ئەگەر خانوویەکی زۆر خۆش هەبێت و تۆ بچی بۆ بینینی ئەو خانووە ، لە کاتی گەیشتن بە خانووەکە و سەیرکردنی سەرت بسوڕێ لە گرنگی ئەو خانووە ، کەچی هەر لەو

کاتەدا کەسێک بێت و بڵێت : برام با ئەوەشت پێ بڵێم کە ئەم خانووە لە خۆیەوە دروست بووە ، تۆ ڕەفتار و هەڵسوکەوتت چۆن دەبێ بەرامبەری ؟ دەی دیارە کە ئەگەر لێی نەدەیت و توڕەنەبیت ، ئەوا جێی دەهێڵیت چونکە ئەو قسەیە قسەیەکی زۆر بێ مانایە .

یەکەم کەس کە ئامێری بیستنی داهێنا پزیشکی فەڕەنسی ( رینیە لینگ ) بوو ، ئەی کێ بوو ئەو گوێیەی پێدای کە ئەگەر سەرنجی چۆنیەتی دروست بوونی بدەیت ئەوا خۆتت پێناگیرێت و تووشی شۆکێکی زۆردەبیت .

یەکەم کەس کە کۆمپیتەری داهێنا ئەندازیاری ئینگلیزی ( چارلز بابیچ ) بوو کە دەتوانیت بڵێیت پێشکەوتووترین ئامێرە لەم سەردەمەدا ، بەڵام بۆ پێم ناڵێیت

کێ ئەو ئینسانەی دروست کردووە و عەقڵێکی پێداوە کە هەزاران کۆمپیتەریشی پێناگات .

یەکەم کەس کە گڵۆپی کارەبایی داهێنا زانای ئەمریکی ( تۆماس ئەدیسۆن ) بوو ، ئەی کێ یە ئەو زاتەی کە وا خۆرێکی زەبەلاحی بە ڕاسەرمانەوە دروست کردووە ، کە دونیا و هەموو شوێنێک ڕۆشن دەکاتەوە بۆ ئەوەی کە خەڵکی بەڕۆژدا هەستن بە کارو پیشەی ڕۆژانەیان و دواتر ئاوا دەبێت و دونیا تاریک دەبێت و کاتی ئیسراحەت و پشووە .

یەکەم کەس کە ئۆتۆمبیلی دروستکرد زانای ئەڵمانی ( کارڵ بێنز ) بوو ، ئەی کێ بوو ئەو دوو قاچەی پێدایت کە پێش ئۆتۆمبیل و ئێستاش پیی دەڕۆیت .

یەکەم کەس کە ئامێری ژمێریاری ( حاسیبە ) ی دروست کرد زانای فەرەنسی ( بلیز باسکاڵ ) بوو ، ئەی

کێ بوو ئەو زاتەی کە وا عەقلێکی دا بەم مرۆڤە کە ئەم ئامێرە دروست بکات ، ئەو عەقلەی کە دونیا لە بەردەمیدا زەلیل بووە و هەرچی شت هەیە دەتوانێت دروستی بکات و بەرهەمی بهێنێت ، ئەو عەقلەی کە کەس پانتاییەکەی نازانێت مەگەر ئەو خودا نەبێت .

یەکەم کەس کە فڕۆکەی داهێنا زانای ئەمریکی ( ولبور ڕایت ) بوو ، ئەی توخوا بۆ پێم ناڵێیت کێ بوو کە ئەم هەموو باڵندەی دروست کرد کە زۆر بە ئاسانی و سادەیی بە ئاسماندا دەفڕێت ، باڵی ئەم باڵندەیە چی تێدایە کەوا بە ئاسانی دەفڕێت .

دەی ئێستا بۆ کەسێک پێم ناڵێت کە فڕۆکە و حاسیبە و ئۆتۆمبیل و کۆمپیتەر و ئامێری بیستن و گلۆپی کارەبایی .... هتد ، لەخۆوە دروست بوون ، دەی چۆن جورئەت ئەکەیت کە ئەڵێیت گوێ و خۆر و عەقڵ و باڵندە

.... هتد ، بەڕێکەوت دروست بووە و دروستکارێکی نیە .

## بەڵگەی بوونی خودا لە دروستکراوەکانیدا

وەک دیارە هیچ شتێکی دروست کراو بەبێ دروستکار نابێ ، بەڵکو دەبێ دروستکارێکی هەبێت ، ئەگەر نا خۆی توانای ئەوەی نیە کە لە هیچەوە خۆی بهێنێتە بوون ، وەک ئەو ئامێر و دروستکراوانەی پێشوو کە باسمان کردن ، بۆ نموونە ئەگەر ( کارڵ بێنز ) ئۆتۆمبیلی دروست نەکردبێت خۆ ئەو ئۆتۆمبیلە توانای ئەوەی نیە کە خۆی خۆی دروست بکات ، دەی ئێمەش دەمانەوێت ئەو دروست کراوانە بکەینە بەڵگە بۆ بوونی زاتێکی باڵادەستر لە گشت بوونەوەرانی سەر زەوی ، چونکە ئەو دروست کراوانەی ئەو زۆر جیاواز و ڕێک و پێک و بێ کێشەن ، خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی بەوە کردووە کە تەماشای

دروستکراوەکانم بکەن بۆ دەرکەوتنی دەسەڵات و باڵادەستی خوای دروستکار ، هەروەک دەفەرمویێت : ( سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ -- فصلت : ٥٣ )

واتە : ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆی بونەوەردا و لە خودی خۆشیاندا ، بۆئەوەی بۆیان ڕوون ببێتەوە کە ئەو زاتە حەق و ڕاست و ڕەوایە .

وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموویێت : ( مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ -- الملک : ٣ ) .

واتە : هەرگیز بەدی ناکەی لە دروستکراوەکانی خودای میهرەباندا لە ناڕێکی و نەنگی .

وە هەروەها خوای گەورە زیاتر نزیک دەبێتەوە بەوەی کە ئەی بۆچی تەماشایەکی نافسی خۆت ناکەیت ئەی ئینسان ( وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُون (٢١) -- الذاريات ) .

واتە : لە خۆشتاندا ( ئایەت و بەڵگە و نیشانە گەلێک هەن بۆ دەرکەوتنی دەسەڵاتی خوا ) ئەرێ بۆ تەماشایەکی ناکەن ( دەرسی لێ وەربگرن ) .

ئێستاش هەندێکیان لێ باس دەکەین بە هیوای ئەوەی کە فکرێک لەو جوانی و ڕێک و پێکیەی کە لەو دروست کراوانەدا هەیە بکەنەوە ، و دەسەڵات و قودرەتی خواتان بۆ دەربکەوێت و هەرگیز بیر لەوە نەکەیتەوە کە ئەم دروست کراوە پڕ لە نیشانە و ئایەتە گەورانە لە هیچەوە دروست بوون بۆ هیچ، وە ببێتە مایەی ئەوەی کە زیاتر بگەڕێن بەدووی دەسەڵاتی خوای باڵادەست .

# وشتر چۆن دروست بووە [1]

وشتر یەکێکە لەو دروستکراوە سەرسوڕێنەرانەی خوای گەورە ، کە بە تەماشاکردنی ئەوەی کە چۆن دروست بووە و چ سیفات و خسوسیاتێکی تێدایە ، گەلێک دەسەڵاتی خوامان بۆ دەردەکەوێت ، دیارە هیچ دروست کراوێک لە دروست کراوەکانی خوای میهرەبان لە زیادە دروست نەکراون بەڵکو هەموویان پێویستن بۆ تەواوکردنی سیستەمی ئەم ژیانە ، ئێستاش حەزدەکەم کە بە عەقڵێکی فراوان و پڕ لە بیرکردنەوەوە تەماشایەکی ئەو سیفات و خسوسیاتانە بکەیت بۆ دەرکەوتنی دەسەڵاتی خوای گەورە :

١- چوار پەلی درێژی هەیە ، کە یارمەتی دەدات بۆ ئەوەی کە لە بیاباندا نەچەقێت ، خۆ ئەگەر کوڵ بوایە ئەوا

---

١) ئەم خەسڵەتانەی وشترم لە کاسیەتی بوونی خوای مامۆستای بەڕێز مامۆستا ناصری سوبحانیەوە ڕەحمەتی خوای لێبێت وەرگرتووە .

پێیەکانی دەچەقین و نەیدەتوانی بڕوات بە ئاسانی ، جا ئیتر فەرقی چیەبوو لەگەڵ ئەسپ و گوێدرێژدا ، وە ژێر پێی وا دروست کراوە کە نەچەقیت مەگەر زۆر بەکەمی .

٢- وە ئەمەندە درێژە کە ناتوانیت بە وەستانیەوە شتەکانت باربکەیت ، هەر بۆیە دەبێت کە دابنەوێتەوە بۆ ئەوەی کە شتەکانی لێباربکرێت ، دەی خۆ جاری واهەیە ئەمەندەی بار لێ ئەنرێ کە ناتوانێت هەستێتەوە ، بەڵام خوای پەروەردگار ملێکی درێژی پێداوە کە بەهۆیەوە دەتوانێت خۆی بەرز بکاتەوە .

٣- چاوی دوو پەردەی هەیە کاتێک لە بیاباندا گوزەردەکات و بایەکی زۆر هەڵدەکات ، ئەویش پەردەی یەکەمی دادەداتەوە ، بەڵام هەر دەبینێت ، بەهۆی ئەمەوە چاوی دەپارێزێت لە زیانی ئەو تەپ و تۆز و خۆڵە .

٤- بەهۆی وشکی بیابان و دەست نەکەوتنی خواردن و خواردنەوە تێیدا ، خوای گەورە ئەم وشترەی وا دروست کردووە کە بەرگەی ئەم نەبوونیە بگرێت ، ئەویش بە بۆنەی زەخیرەکردنی ئاو لە ناو سکیدا و خواردنەکەشی بەشێوەی چەوری لەو بەرزاییەی سەر پشتیدا هەڵی دەگرێت ، وشتر دەتوانێت نزیکەی ٧ ڕۆژ تا ١٠ ڕۆژ بمێنێتەوە بەبێ خواردن و خواردنەوە .

دەی ئێستا عەقڵت ڕێگەت پێدەدات کە ئەم هەموو خاسیەتە جوانە لە وشتردا هەیە لە خۆوە دروست بووبێت و دروست کارێکی نەبێت ، دەی چیەبوو گەر یەکێک لەو سیفەتانە لە وشتردا نیە ، قاچ کوڵی بوایە ، یان چاوی وەک خۆمان وابوایە .

## جومگە چۆن دروست کراوە

جومگە بریتیە لە شوێنی بەیەک گەیشتنی دوو ئێسک ، خوای پەروەردگار جومگەی لە لەشی مرۆڤ دا دروست کردوە بۆ ئەوەی بە ئاسانی بجوڵێت و نارەحەت نەبێت لەکاتی رۆشتندا ، لەم جومگەیەدا کۆمەڵێک ئامێر " ئەگەر شیاو بێت " دروست کردوە بۆئەوەی پیشانی خەڵکی بدات کە هیچ کەم وکورتی یەک لە دروست کراوەکەیدا نیە ، بۆ نموونە :

١- جومگە پێکهاتووە لە دوو ئێسک کە بەهۆی بەستەرەکانەوە پێکەوە دەبەسترێنەوە ئەم پێکەوە بەستنە ئێسکەکان زیاتر مەحکەم دەکات .

٢- لەناو جومگەدا کرکراگە هەیە کە سەری ئێسکەکان دادەپۆشن بۆئەوەی ئێسکەکان لە یەک نەخشێن و تەنک نەبن ، بەڵام ئەگەر بهاتبایە کە ئەو کرکراگەیە نەبووایە

ئەوا تەقەتەقێک لە جومگەکەدا دروست دەبوو بەهۆی لێکخشانی دوو ئێسکەکەوە ، و دەبووە هۆی دروست بوونی ئازار لەم جومگەیەدا .

٣- خوای کارزان شلەیەکی لینجی لەناو جومگەدا دروست کردوە بۆ خلیسک کردنی نێوان دوو ئێسکەکە بۆئەوەی بە ئاسانی بجولێت ، هەرکات لینجی و چەوری بەینی ئەو ئێسکانە کەمبوو ، دیسانەوە خلیسک و چەوریان بکات .

## زەوی و بەرگە هەوا و خۆر و مانگ

زەوی بریتیە لە پێکهاتەیەکی شێوە هێلکەیی کە نیوەتیرەکەی ١٢.٧٥٦ کیلۆ مەترە ، وە بە خێراییەکی سەرسورهێنەر دەجولێت لە بۆشاییدا کە ٦٨ هەزار میلە لە کاتژمێرێکدا ، وە زەوی دەوردراوە بە چەند چینێکی هەوایی کە پێنج چینە ، پێکهاتووە لە هایدرۆجین و ئۆکسجین و گازەکانی‌تر ، وە بەدەوری خۆیدا دەسورێتەوە بە

خێرایی هەزار میل لە کاتژمێرێکدا ، وە زەوی لەکاتی خولانەوەیدا گۆشەیەک دروست دەکات کە ٢٣.٥ پلەیە .

ئێستا من ئەم پرسیارانە دەکەم کە بۆچی ئەو ژمارانەی سەرەوە وابن دەی با یەک ڕۆژ کەم و زیادێک بکەن ؟ دەی خۆ زانست ڕێگەمان نادات کە کەم و زیاد بکات ، چونکە یەکسەر ئەم کەونە و زەوی بەتایبەت تێکدەچێت .

بۆچی خۆر تۆزێک نزیک نەبێتەوە ؟ زانست پێمان دەڵێ کە ئەگەر تەنها بەقەد یەک مسقالە زەڕڕە خۆر لە زەوی نزیک ببێتەوە ، ئەوا هەموو دونیا دەبێتە ئاگر .

دەی باشە با کەمێک دوور بکەوێتەوە ؟ ئەمەشیان هەروایە چونکە بە دوورکەوتنەوەی خۆر لە زەوی ، دونیا دەبێتە یەک پارچە لە سەهۆڵ .

دەی با مانگ تۆزێ بجولێ ، ناشێ ئەمەشیان نەتوانرێت ؟ بەڵێ دەکرێت بەڵام کاتێک دەکرێت یان دەبێ هەموو

دونیا ببێت بە ژێر ئاوەوە یان هەموو دەریاکان بۆگەن بکەن .
دەی توخوا سەرنجێکی ئەم ڕێسا و یاسایە جوانانە بدە ، چۆن ئەو عەقڵە گەورە و فراوانەی کە خوا پێی داوی ئەمە قبوڵ دەکات کە بوونی ئۆکسجین بۆ هەناسەدانی مرۆڤ ، کە دەتوانی بڵێیت ، هەموو ژیانی مرۆڤی لەسەر بەندە ، دروستکارێکی نیە و بەڕێکەوت ئەم ڕێسا ویاسایانە دروست بوون ، ئەو ئۆکسجینەی کە خانەکان بەبێ ئەو ناتوانن بەردەوامبن لە کارکردن چونکە خانەکان پێویستیان بە ئۆکسجین هەیە ، وە دەبێ دوانە ئۆکسیدی کاربۆنیان لێ دووربخرێتەوە و بکرێتە دەرەوەی لەش ، دەی جا ئەم هەموو مرۆڤە ئۆکسجین بەکاردێنێ ، چۆن تەواو نابێ ، نا .. نا خوای پەروەردگار زانا و دانایە بە هەموو کردارێک ، لە لایەکی ترەوە قەرەبووی کەمبوونەوەی ئەم ئۆکسجینەی کردووەتەوە ، بەوەی کە درەختەکانی دروست کردووە کە

بەردەوامن لە بەرهەمهێنانی ئۆکسجین و بەکارهێنانی دوانە ئۆکسیدی کاربۆن بۆ کردارەکانیان ، ئەی بۆ ئەم کردارە پێچەوانە نەکەینەوە و با ئەوانیش ئۆکسجین بەکاربهێنن و دوانە ئۆکسیدی کاربۆن دەربدەنەوە ، دەی خۆ ئەو کات ئۆکسجین نەدەما ، دەی ئەگەر ئیشی ڕێکەوتە ، مانای هەیە کە ئەم هەموو کردارە لە خۆوە و بە سوتفە دروست بوون و دروست کاری نیە .

## دەماخ و ماسولکە چۆن دروست کراوە

یەکێکی تر لەو نیعمەتانەی خوای خاوەن حیکمەت بە مرۆڤەکانی بەخشیووە ئەوەیە کە ئامێرێکی پێبەخشیوە کە دەتوانێت کۆنترۆڵی زۆربەی کردارەکانی ناو لەشی مرۆڤ بکات ئەویش " دەماخ " ـە ، لەکاتی کردنی هەر کارێکدا دەبێ دەماخ ئاگادار بکرێتەوە کە ئاگادارکردنەوەکان لەڕێگەی دەمارە ڕاگەیاندنەکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ دەماخ و

لەوێدا بە تەواوەتی لێکدەدرێتەوە و وەڵام دەدرێتەوە ، بۆ نموونە : کاتێک کەسێک بیبیەوێت قورساییەک یان هەرشتێکی تربەرز بکاتەوە ئەوا دەماخ ماسولکەکان ئاگادار دەکاتەوە بەپێی بارستەی تەنەکە ، واتە ئەگەر تەنەکە قورس بوو ئەوا ژمارەیەکی زۆر لە ماسولکەکان ئاگادار دەکرێنەوە ، وە ئەگەر تەنەکە سوک بوو ئەوا ژمارەیەکی کەمتر لە ماسولکەکان ئاگادار دەکرێتەوە بۆ هەستان بە ئەنجام دانی کارەکە ، بە بێ ئەوەی لێی تێک بچێت ، دەی توخوا دەچێتە عەقڵەوە ئەم کارە کەسێک نەبێت بە باشی چاودێری بکات وبەرێوەی ببات ، ماسولکەکان لە دوو بەشی بچوک پێک دێن ، کە " ئەکتین و مایۆسین " ە کاتێک تەنەکە بەرز دەکەیتەوە ئەوا ئەکتین و مایۆسین پێکەوە دەبەسترێن بۆ ئەوەی ماسولکەکان گرژ ببن و قورساییەکە بەرزبکاتەوە ... پاک و بێگەردی بۆ ئەو

خوایەی کە ئەم هەموو کارە جوانە لە ناو لەشماندا ڕێکخستووە ...

## لیك و لیکە ڕژێنەکان

بۆئەوەی کە ژیانێکی باشتر بژین ، خوای پەروەردگار ئەم لیک و لیکە ڕژێنانەی لەناو دەم و قوڕگ و کۆمەڵێک شوێنی تایبەتی تردا دروست کردووە ، ئەم لیکانە کاری زۆر ڕێک دەخەن و ئیشێکی زۆر ئەنجام دەدەن ، وا هەندێکیان باس دەکەم :

١- ئەم لیکە ڕژێنانە هەڵدەستن بە تەڕوو شێدار کردنی دەم و شوێنە هەستیاریەکانی جەستەمان ، بۆ ئەوەی کە وشک نەبێتەوە و زیان بە جەستەمان بگات ، بۆ نموونە ئەگەر هاتوو ئەم لیکە ڕژێنانە لە بۆری هەناسەدا لەکار بکەون ، ئەو کاتە ناتوانرێت کە هەناسەدان بە شێوەیەکی گونجاو ئەنجام بدرێت ، ئەو بڕە لیکەی کە دەردەدرێت ڕۆژانە ٠.٥

تا ١.٥ لیترە ، کە گەر بێتوو لەو بڕە کەمتر دەربدرێت ئەوا ئەو کردارانەی کە لەناو لەشدا بە یارمەتی ئەو کاردەکەن ، کارەکانیان زۆر بە نارەحەتی ئەنجام دەدەن ، وەگەر بێتوو کە زیاتر دەربدرێت ئەوا مرۆڤ بیزار دەکات بەهۆی زۆر قوتدانی لیکەوە .

٢- یەکێکی‌تر لەو کارە جوانانەی ئەم لیکانە ئەوەیە کە یارمەتی جوین و ئاسان قوتدانی خۆراک دەدات ، دەی دیارە ئەگەر ئەم لیکانە نەبن ئەوا ئەو پاروەی کە دەیخەیتە دەمت ئوا هەر بەوشکی دەمێنێتەوە و لینج نابێ بۆ ئەوەی کە بە ئاسانی قوت بدرێت ، وە ئەگەر لە کاتی قوتداندا ئەو بۆریە لینج نەبێ بە مادەی لینجی و ئەو لیکاوە ئوا ئەو پاروە لە ناو قورگتدا دەگیرێت و هەناسەت بۆ نادرێت

٣- بەهۆی ئەوەی کە لیک مادەیەکی تفتە ، ئەوا دەبێتە هۆی هاوسەنگ کردنی ترشێتی ناو گەدە و ئەو ترشانەی

تریش کە لە ڕێی دەمەوە دەچنە ژوورەوە .

٤- ئەگەر لیک نەبێ ئەوا دەممان ئازارێکی زۆری پێدەگات بەهۆی ئەو خواردنە گەرم و ساردانەوە کە دەیخۆین ، بەڵام لیک دەبێتە هۆی ساردکردنەوەی خواردنی گەرم و گەرم کردنی خواردنی سارد .

٥ – لیک مادەی دژە بەکتریای تێدایە ، بۆ لە ناوبردنی ئەو بەکتریا زیان بەخشانەی کە دێنە ناو دەم .

دەی باشە دەزانی کاتێک تۆ دەخەویت ئەو لیکە زۆرەی کە دەری دەدەیت چی بەسەردێت ؟ کاتێک مرۆڤ دەخەوێت و ئاگای لە خۆی نامێنێت و لیک لە دەمیدا زۆر دەبێت ، ئەو کاتە نامەیەک دەگات بە دەماخی و ئاگادار دەکرێتەوە لە زۆری لیک ، ئەویش لای خۆیەوە نامەیەک دەنێرێت و فەرمان بە داخستنی بۆری هەناسە دەکات ، بۆئەوەی کە لیکەکە قوت بدرێت و نەچێتە ناو بۆری

هەناسە و زیانت پێ بگات ، بەڕاستی من نازانم چ گوتەیەک بڵێم بۆ سوپاس گوزاری خوا تەنها ئەوە نەبێت بڵێم (لا إله إلا الله . . . لا إله إلا الله . . . لا إله إلا الله ) .

دەی ئێستا ویژدانت ڕێگەی ئەوەت پێدەدات کە بڵێیت هەموو ئەم کارە جوانانە کە ڕوودەدات لە خۆوە بێت و ڕیکەوت وای لێکردبن .

لە کۆتایدا ئەم قسەیەی مامۆستا سەعیدی نوورسی دەهێنمەوە ( ڕەحمەتی خوای لێبێت ) کە لەبارەی دروست بوونی ئەم جیهانە و ئەم بوونەوەرانەوە دەیکات و دەڵێت :

( ئەی ئەو کەسەی کە بەم جیهانە جوان و ڕازاوەیەی لەبەردەستت دایە ، دەڵێیت لە خۆوەوە دروست بووە و ڕێکەوت و سوتفە وایان لێ کردووە ، عەقڵت بخەوە کار و سەرنجێکی ئەم نموونەیە بدە و بزانە ویژدانت ڕێگەت پێدەدات کە بڵێیت ئەم هەموو ڕیسا و یاسا جوانە لەخۆوە دروست بووە :

وا دابنێ کە دەرمانخانەیەکمان هەیە و قوتوی دەرمانی تێدایە و مادەیشی تێدایە بۆ دروست کردنی دەرمانەکە ، ئایا دەتوانی بڵێیت ئەگەر ئەم دەرمانانە کە دروست بوون لە خۆیەوە تۆزێک لەو دەرمانە و تۆزێکی تر لەوی تر و تۆزێکی تر لەوی تر و ... هتد ، چوونەتە ناو ئەم شوشەیە و ئەم دەرمانەیان پێک هێناوە کە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیە کوشندەکان بەکاردێت ) .

دە ئیتر خۆت بڕیار بدە ئایا دەگونجێ ئەم دەرمانانە کە بە مسقاڵێک لەوە و بە مسقاڵێکی تر لەوی تر و ... هتد ، لە خۆوە دروست ببێت .

## بەڵگەیی فیزیایی بۆ بوونی خودا

ئەگەر بەباشی سەرنجی یاساکانی فیزیا بدەین ، ئەوا ئەم یاسایەمان بەرچاو دەکەوێت کە دەڵێت : بۆ ڕوودانی هەموو کارێک دەبێت کارکەرێک ( بکەر ) ێک هەبێت لە

پشتیەوە ، بەڵام ئەگەر کار هەبێت و کارکەر ( بکەر ) نەبێت ، ئەوە خۆدیارە هیچ شتێک ڕوونادات .

ئەوانەیشی کە دەڵێن ئەم بیر و بۆچونە وانیە ، حازر نین کە دان بنێن بەوەدا کە دروست بوونی یەک خانوو یان هەرشتێکی‌تر بە ڕێکەوت بووە و کەسێک نەبوو ببێت بە بکەر لە دروست بوونی ئەو خانووە یان هەرشتێکی‌تردا .

بۆنموونە ئەو بیردۆزەی ئێستا باوە بۆ دروست بوونی زەوی و کەون بیردۆزی ( بینگ بانگ ) ـە ، کە باس لەوە دەکات کە ئەم جیهانە لە ئەنجامی تەقینەوەیەکی گەورەوە دروست بووە ، دەی خۆ ئێمەش دژی ئەوە نین کە ئەم جیهانە وا درووست بووە ، بەڵام ئەوەی کە مایەیی ڕاجیاییە لە نێوان ئێمە و ئەواندا ( ئەڵبەت هەموویان نا بەڵکو کەمێکی فکر تەسک ) ئەوەیە کە دەڵێن ئەم تەقینەوەیە لە خۆوە درووست بووە ، بەڵام عەقڵ و واقیع ڕێگە بە ئێمە

نادات کە وا بڵێین لە کاتێکدا بەپێی یەکێک لەو بنەما و ڕێسا زانستیانەی کە لەلای خۆیان دانراوە کە بنەمای ( ئینترۆپی ) یە دەڵێت کە هیچ ڕووداوێکی زانستی بەبێ ئەوەی کە کۆنترۆڵ بکرێت لەلایەن کەسێکەوە یان زاتێکەوە ئەوە ئەو ڕووداوە پشێوی و هەڕەمەکی لە دوای خۆی دێنێت دەی ئەمەش ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە هەموو تەقینەوەکان بەشێکی زەرە و زیانە ، بەڵام ئەم تەقینەوەیە جیهانێکی ئاوا ڕێک و پێکی لێدەرچووە ؟ .

## بەڵگەی بیرکاری بۆ بوونی خودا

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەم ڕۆژگارەدا ئەوەیە کە خودای پەروەردگار لە هەموو بوارێکدا ، کۆمەڵێک ئاسەوار و جێدەستی خۆی داناوە بۆ دەرکەوتنی توانا و دەسەڵاتی خۆی ، زانستی بیرکاریش یەکێکە لەو زانستانەی کە خوای پەروەردگار کۆمەڵێک ئاسەوار و جێدەستی خۆی

داناوە تێیدا ، بۆیە منیش حەزم کرد کە ئەوەش باس بکەم بۆتان :

زاناکانی بیرکاری وتوویانە کە با دابنێین ١٠٠ نەوەمان هەیە بەبێ ژمارە ١ ، ئەگەر بپرسیت لە نەوەی ١٠٠ هەم کەکێ تۆی هێناوەتە بوون ئەوا دەڵێت لە ڕێگەی دایک و بابمەوە کە نەوەی ٩٩ هەمن ، نەوەی ٩٩ هەمیش هەروایە ئەگەر بپرسیت کە کێ تۆی هێناوەتە دونیا ، دەڵێت کە لە ڕێگەی دایکم و باوکمەوە هاتووم ، ئەمە هەر بەردەوام دەبێ تا نەوەی ٢ هەم دوای ئەو دەڵێت کە خوا دروستی کردووم کە ژمارە ١ کە ( بە بێ تەشبیهـ ) دەی کاتێک لە زانا بیرکاریەکان بپرسیت ئەی ژمارە ١ کێ درووستی کردووە ، ئەویش دەڵێ دەی خۆ دوای یەک هیچە یان سفرە کە هەر واتاکەی هیچە ، دەی خۆ هیچ نابێ بە بنەما بۆ بوونی دوای خۆی ، ئیللا دەبێ کە بنچینەیەک و خاڵیکی

کۆتایی هەبێت بۆ تەواو بوونی ئەو زنجیرەیە ، دەی با ئەوەش بزانن کە ژمارە یەک لە علومی بیرکاریدا ژمارەیەکی ئەزەلیە .

## قورئان بەڵگەی بوونی خودایە

یەکێکی‌تر لەو بەڵگانەی کە دەیسەلمێنن کە خودا هەیە ، قورئانی پیرۆزە چونکە لە قورئاندا کۆمەلێک ئیعجازی تێدایە کە زاناکانی ئەمڕۆی سەرسام کردووە ، هەرچی شتێک کە قورئان باسی کردبێت ، هەموو وەک خۆی هاتووەتە دی ، هەندیکیان سالانێک لەمەوبەر هەندێکیان لەم سالانەدا ، و هەندێکیان لە داهاتوودا دێتەدی ، بۆ نموونە :

١- قورئان باسی ئەوەی کردووە کە دوو بەحر هەن لەپاڵ یەکدا و تێکەڵ بەیەک نابن ، بەڵکو بەربەستێک لە

نێوانیاندا هەیە ( مَرَجَ البَحْرَيْنِ يَلْتَقِيانِ (١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لا يَبْغِيَانِ (٢٠) -- الرحمن ) .

دەی یەکێک لەو کەسانەی کە دەگەڕا لەناو دەریادا ، ڕۆژێک ڕێی لەم دوو دەریایە دەکەوێت و دواتر دێتەوە و بە خەڵکی ڕادەگەیەنێت و دەڵێت کە شتێکی زۆر گرنگم دۆزیوەتەوە ، خەڵکیش پێی دەڵێن چیت دۆزیوەتەوە ، ئەویش دەڵێ کە دوو دەریام دۆزیوەتەوە تێکەڵ بەیەک نابن و ئاوی هەریەکەیان جیاوازە و گیانلەبەرانیشی جیاوازن کە هیچ یەکێکیان لەویتریاندا ناتوانێت بژی مەگەر زۆر بە دەگمەن .

٢- قورئان باسی ئەوە دەکات کە فیرعەون بە خنکان مردووە ، ئەویش دوای ئەوەی کە خۆی و جەیشەکەی کەوتبوونە دوای موسا پێغەمبەر ( سەلامی خوای لێبێت ) بەڵام لەناو دەریاکەدا خنکا ، دوایی چەندەهاساڵ لەو باسکردنەی کە قورئان کردی ، تیمێکی ئەوروپی هاتن و پشکنینیان بۆ

جەستەی فیرعەون کرد بۆیان دەرکەوت کە ڕاستە فیرعەون بە خنکاندن مردووە .

٣- قورئان باسی نزمترین خاڵی کردووە لە زەویدا ، ئەویش ئەو شوێنەیە کە فارسەکان و ڕۆمەکان جەنگیان تێدا ئەنجامدا و فارسەکان ڕۆمەکانیان تێکشکاند و سەرکەوتن بە سەریاندا ، بەڵام هەر ئەوکات قورئان هەواڵی دووبارە سەرکەوتنەوەی ڕۆمەکانی بە خەڵکی ڕاگەیاند لە ماوەی یەک ساڵ بۆ نۆ ساڵ چونکە وشەی ( بِضْعِ ) ئەو مانایە دەگەیەنێت لە زمانەوانیدا ( غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) فِي بِضْعِ سِنِينَ (٤) -- الروم )

٤- پیشاندانی ئەوەی کە زەوی شێوەی گۆییە ( نەک گۆیی تەواو ، بەڵکو هێلکەییە ) ، لەکاتێکدا خەڵکی لەڕابردوودا وایان دەزانی کە زەوی تەختە ، بەڵام زانا ( فرانسیس درەیک ) یەکەم کەس بوو کە سەلماندی زەوی

گۆییە ، بەڵام ئەگەر تەماشای قورئانی پیرۆز بکەین زۆر لە مێژە هەواڵی ئەوەی پێداوین ، ئەویش بە ئایەتی ( وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا (٣٠) -- النازعات ) واتە : زەویمان بەشێوەی هێلکەیی بەدیهێناوە .

ئەگەر تەماشا بکەین وشەی ( دحاها ) لە زمانی عەرەبیدا واتە هێلکەی وشترمرخ یان نەعامە ، کە شێوەی زەوی زۆر دەچێتەوە سەر ئەم هێلکەیە .

٥- لە سەردەمی زوودا باوەڕ وابوو کە زەوی و مانگ دەجولێن و خۆر ناجولێ ، تەنانەت زاناکانیش وەک زانای بەناوبانگ ( نیکۆلاس کۆپەر نیکۆس ) بەڵام قورئان نەفی ئەم بابەتە دەکات و دەفەرمووێت خۆریش دەسوڕێتەوە ( وَ هُوَ الَّذي خَلَقَ اللَّيْلَ وَ النَّهارَ وَ الشَّمْسَ وَ الْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ (٣٣) – الأنبياء ) واتە : خوا ( ئەو زاتەیە ) کە شەو و

ڕۆژ و خۆر و مانگی دروخست کردووە ، وە هەمووشیان لە ڕێڕەوی خۆیاندا مەلەدەکەن ( دەسوڕێنەوە ) .

٦- زانای ئەستێرەناسی ئەمریکی ( ئیدوین هۆبڵ ) چەند بەڵگەیەکی دۆزییەوە کە دەیسەلماند گەلە ئەستێرەکان لێک دووردەکەونەوە ، دەتوانین ئەمەش بکەینە بەڵگەی فراوان بوونی گەردوون ، وە هەروەها زانای بەناوبانگی فیزیایی ( ستیفن هاوکین ) لە کتێبەکەیدا دەڵێت ( دیاردەی فراوان بوونی گەردوون گەورەترین دۆزینوەی زانستی و شۆڕشێکی زانستی مەزنی سەردەی بیستەم بوو ) وە ئەم بابەتە قورئان زۆر زوو ڕوونی کردووەتەوە ، هەروەک دەفەرموویێت ( وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَييدٍ وَ إِنَّا لَمُوسِعُونَ (٤٧) -- الذاريات ) واتە : ئاسمانمان بە هێز و دەسەڵاتی خۆمان دروست کرد و بەردەوامیش گەورە و فراوانی دەکەین .

شتی تر لەمانە زۆرن بۆ باسکردن بەڵام ناکرێت لێرەدا هەمووی باس بکەین ، بۆیە هەر کەس حەز دەکات با خۆی بەدوایدا بڕوات و شتی زۆرتر لەمانە و سەیرتر لەمانە کە لە قورئاندا باسکراوە و زانست سەلماندوویەتی .

کۆتا شت کە لێرەدا باسی بکەم ئەوەیە کە زانای بەناوبانگی فەرەنسی ( مۆریس بۆکایی ) قۆناغەکانی ژیانی کۆرپەلەی ئاشکرا کرد و وای زانی کە خۆی یەکەم کەسە کە زانیویەتی پێی ، بەڵام دواتر پێیان وت کە لە قورئاندا هەموو ئەمانەی تۆ باسکراوە ١٤٠٠ ساڵ زیاتر دەبێ کە ئاماژەی پێ کردووە ، ئەویش سەیری لێدەهات و وتی کوا با بیبینم ، کاتێک نیشانیاندا ، بۆی دەرکەوت کە تەواوە وایە ، و زۆر بەجوانی ئاماژە بە قۆناغەکان کراوە بۆیە دواتر لێکۆڵینەوەیەکی کرد لەسەر ئەو زانیاریانەی کە لە هەرسێ کتێبی ئاینی ( تەوڕات و ئینجیل و قورئان )

ـدا باس کراوە ، ئەم لیکۆڵینەوەیەی نزیکەی ١٢ ساڵی خایاند و لە هەموو بوارەکاندا لێکۆڵینەوەکەی کرد ، لە کۆتایدا بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشت :

١- ئەو زانیاریانەی کە لە تەوڕاتدا هەیە تەنها لە سەدا ١٠ ی دەرچووە و لە سەدا ٩٠ ی هەڵە دەرچووە .

٢- وە هەروەها ئینجیلیش هیچی لە تەوڕات زیاتر و کەمتر نەبوو ، بەڵکو ئەویش ڕیک لە سەدا ١٠ ی دەرچوو و لە سەدا ٩٠ ی هەڵە دەرچووە .

٣- بەڵام کاتێک تەماشای ئەو زانیاریانەی دەکرد کە لە قورئاندا باس کراوە و تەماشای ئەو ئەنجامانەی دەکرد کە لە لێکۆڵینەوەکەدا بۆی دەرکەوتووە و بەراوردی یەکتری دەکردن بۆی دەرکەوت کە لە سەدا ١٠٠ ی دەرچووە و هیچی هەڵە دەرنەچووە .

بۆیە هیچی بۆ نەمایەوە جگە لەوەی بڵێت (أَشْهَدُ أَنْ لا إله إلَّا اللّٰه وَأَشْهَدُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰه ) وە سوپاس بۆ خودا بە موسڵمانی گیانی لەدەستدا .

لە کۆتایی ئەم بەشی یەکەمەدا قسەیەکی ( إبن عطاء الله السكندري ) دەهێنمەوە کە زۆر کاریگەرە بەلامەوە ، ئەویش ئەوەیە کە دەفەرمووێت : ( پەروەردگارا بەڵگەت لەسەر بهێنمەوە ، لە کاتێکدا هەموو بوونەوەر ئاثاری تۆن ؟ ئایا جگە لە تۆ دەرکەوتن دروست کراو هەیە هی خۆت نەبێ ؟ کەی و چ کاتێک ونیت تا پێویست بە بەڵگە بکات لەسەر بوونت ؟ وە کەی دوورکەوتیتەتەوە تا بە شوێنەوارتا پێت بگەین ؟ ) .

## بیروڕای زانایان لەبارەی بوونی خواوە

بەهۆی پێشکەوتنی زانست و زۆربوونی بەڵگەکانی دەسەڵاتی خوا زۆرێک لە زانایان ناتوانن خۆیان لەو ڕاستیە بشارنەوە کە خوا بوونی هەیە ، لەوانەش :

١- گالیلۆ : کاتێک تێبینی جوڵانی بەندۆڵی کردوو ، بە جوانی تێیڕاما ، دەستی کرد بە بەندایەتی کردن بۆ خوا .

٢- لۆرد کیلفن : زانای سروشتی و دانەری گەرمی پێو ئەڵێت ( ئەگەر زۆر بیر بکەیتەوە زانست وات لێدەکات کە بڕوا بێنی بە خوای گەورە و دروستکاری ئەم بوونەوەرە ) .

٣- کۆپەر نیکۆس : باوەڕبوون بەخوای گەورە وای لێکرد کە یاسای جوڵانی خۆر بدۆزێتەوە ، چونکە بڕوای وابوو ئەوەی خوا دروستی بکات بێ یاسا ناجوڵێتەوە .

٤- ئەنیشتاین : خودی ئەنیشتاین دەڵێت ( هێزێکی گەورەی دەروونی پاڵم پێوە دەنێت کاتێک سەیری ئەم بوونەوەرە دەکەم

بۆئەوەی باوەڕ بەو خودایە بێنم کە خۆی نادیارە و دروستکراوەکانی شاهێدی لەسەر دەدەن ) .

وە لە یەکێکی تر لەو قسە جوانانەی ئەنیشتاین ئەوەیە کە دەڵێت ( زانست بەبێ بڕوا بەخوا وەک شەل بە یەک قاچ ئەڕوات وایە ، وە بڕواش بەبێ زانست وەک کوێر پەل بکوتێ وایە ) .

٥- بول کلارثر ئارسولد : کە بەڕێوبەری یەکێکە لە کارگانەی کە وزەی ئەتۆمی بەرهەم دەهێنن دەڵێت ( ئەوەی جێگەی باوەڕە ئەوەیە کە ئەم بوونەوەرە هەر لەخۆوە نەهاتووەتە کایەوە ، بەڵکو دەبێت لە کاتێکی دیاری کراوەوە دەستی پێکردبێت و هێزێکی گەورە و زانا و خاوەن توانا دروستی کردبێ کە خوایە ) .

٦- میرفت ستانلی کونجدن : زانای فیزیا و زانستی دەروونی و فەلسەفەیە دەڵێت ( ئەوەی لەم بوونەوەرەدا ئەیبینم

هەمووی بەڵگەیە لەسەر بوونی خوا و گەورەیی و دەسەڵاتی ئەو خوایە ) .

لە کۆتاییدا ئەو سەرژمێریری دکتۆر ( دینارت ) دەخەینە ڕوو کە کردوویەتی لە بارەی ئەوەی کە چەند زانا باوەڕدار بوون و چەندیان بێ باوەڕ و چەندیان گومانیان هەیە لە کۆی ( ٢٩٠ ) زانا و فەیلەسوف :

١- لەو ژمارەیە ( ٢٤٢ ) یان باوەڕێکی زۆر بەهێزیان بە خودا هەیە .

٢- وە ( ٢٨ ) یان لە گوماندان لەبارەی بوونی خواوە و خەریکی لێکۆڵینەوەن .

٣- بەڵام ( ٢٠ ) یان بێ باوەڕن بەرامبەر بە خوا .

پرسیاری دووەم

## ئەگەر خودا هەیە بۆچی نایبینم ، من باوەڕ بەشتێك ناكەم نەم دیبێت ؟

یەکێکی تر لەو قسانەی کە دەکریت لەبارەی خوداوە ئەوەیە ، کە هەرچی نەیبینم باوەڕی پێناکەم ، چۆن دەیسەلمێنی کە خودا هەیە ، لەکاتێکدا من ئەوەی نەی بینم باوەڕی پیناکەم .

پێویستە ئەوە بزانریت کە هەر شتێک نەبینرێت ، مانای نەبوونی ئەو شتە نیە ، بۆ نموونە ئەگەر دەڵێیت من هەر شتێک نەیبینم باوەڕی پێناکەم وەرە با ئەم شتانەت پێبڵێم بزانم تۆ قەت ڕۆژێک لە ڕۆژان دیووتن ( عەقڵ ، هەست ، سۆز ، هەوا ، بۆن ، ڕۆح ، ئێش و ئازار .. ) دەی کەوایە ئەگەر نەت دیووە ، ئەوا ئەمە دەتوانرێت بکرێتە بەڵگەیەک بۆ ئەوەی کە نەبینین نابێتە بەڵگە لەسەر

نەبوونی ئەو شتە .

بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی ئەم باسە حەز دەکەم تەماشایەکی ئەم چیرۆکە بکەین و لیَیەوە فێرببین کە نەبینین مانای نەبوون نیە :

دەڵێن ڕۆژێک ئەنیشتاین لە کتێبخانەکەی خۆیدا دەبێت و سەرقاڵە ، لەو کاتەدا کابرایەک دێت و ئەم پرسیارەی لێدەکات ، ئەنیشتاین ئەریَ تۆ باوەڕ بەو قسەیە دەکەیت کە دەڵێن خوا هەیە ؟ دەی ئەگەر هەیە بۆچی من نایبینم ؟ وەک دیارە و هەمووان دەزانین کە ئەنیشتاین پیاویکی زیرەک بووە ، بۆیە بە پیاوەکە دەڵێت : ( تەماشایەکی ئەم کتیبخانەیەی من بکە ، ئایا وشەکانی ناو ئەم کتێبخانەیە دەبینی ، پیاوەکەش دەڵێ نەخێر ، ئەنیشتاین دووبارە پرسیار دەکات و دەڵێت ئەی ئایا دەبینی چەند دێڕی تێدایە ، پیاوەکەش دووبارە دەڵیَ نەخێر ، ئەنیشتاین دەڵیَ دەی

نەبینینی تۆ بۆ ئەم وشە و دێڕانە لەناو ئەم کتێبانەدا مانای وایە کە نیە ؟ دەی خوایش ئاوایە باش بزانە .

## گفتوگۆی نێوان مامۆستا و قوتابیەکانی

ڕۆژێکیان مامۆستایەک وانە بە قوتابیەکانی دەڵێت و لەکاتی وانە وتنەوەدا ئەیەوێ قوتابیەکان والێ بکات کە باوەڕیان بە بوونی خودا نەبێت بۆیە دەست دەکات بەم پرسیارانە :

قوتابیە خۆشەویستەکان بابەتێک هەیە کە زۆربەی خەڵکی باوەڕیان پییەتی کەچی دوورە لە ڕاستیەوە ، منیش حەز دەکەم کە تێتان بگەیەنم و دوورتان بخەمەوە لەو شتە ناڕاستیە ، ئەویس بوونی خوایەکە کە دەڵێن زاتیک هەیە ئەم جیهانەی دروست کردووە ، کەچی وانیە ، ئەگەر وابوایە ئەوا دەمان بینی وەک ئەمانە :

مامۆستا دەڵێ ئەم تەختە ڕەشە دەبینن ؟ قوتابیەکانیش دەڵێن بەڵێ ، مامۆستاش دەڵێ کەواتە ئەم تەختە ڕەشە بوونی هەیە ، مامۆستا دەڵێ ئەی ئەم تەباشیرە دەبینن کە بەدەستمەوەیە ؟ قوتابیەکانیش دەڵێن بەڵێ ، مامۆستاش دەڵێ کەواتە ئەم تەباشیرە بوونی هەیە ، مامۆستا دەڵێ ئەی خوا دەبینن ؟ قوتابیەکانیش دەڵێن نەخێر ، مامۆستاش دەڵێت دەی کەوایە خوا بوونی نیە ، لەو کاتەدا قوتابیەکان سەریان سوڕدەمێنێ و قوتابیەک هەڵدەسێت و دەڵێ مامۆستا یانی ئەوەی نەیبینین بوونی نیە ؟ مامۆستا دەڵێ بەڵێ ، قوتابیەکەش دەڵێ قوتابیەکان ئایا ئێوە عەقڵی مامۆستا دەبینن ؟ قوتابیەکانیس دەڵێن نەخێر ، قوتابیەکەش دەڵێ دەی کەوایە مامۆستا عەقڵی نیە و بێ عەقڵە .

# شوانیك زانایەك عاقڵ دەكات [١]

پیاوێک هەبوو کە لە شاردا دەژیا و خۆی بە زانا و فەیلەسوف دەزانی ، ئەم پیاوە زۆر خۆبەزلزان بوو و دەیوت کە خودا بوونی نیە ، و هەمیشە دژایەتی بوونی خودای دەکرد ، ڕۆژێکیان ڕیگەی دەکەوێتە بیابانێک و سەیر دەکات ڕەشماڵێک هەڵدراوە و پیاوێکی تێدایە کە دەشتەکیە و بەژیانی شاری نەدیووە ، دەستی بەرزکردووەتەوە بۆ ئاسمان و لە خودا دەپاڕێتەوە و دەڵێ خوایە بە گەورەیی خۆت لەو ئاسمانەوە بارانمان بۆ بباریێنی ، ئەو مەڕ و ماڵاتە تینویەتی و ئەو گژوگیایە وشک بووە و من بەچی ئەم مەڕ و ماڵاتەم بەخێوبکەم ، بۆیە پیاوە خۆبەزلزانەکە زەردەخەنەیەک دەیگرێت و دەڵی وەرە ... وەرە ئاوێک

---

١) لەوتارێکی مامۆستای بەڕێز فاتیح شارستانیەوە وەرمگرتوو .

دۆیەک شتێکم بەرێ ئەوە چی دەکەیت ؟ تۆ ڕووت کردووەتە ئەم ئاسمانە و دەپاڕێیتەوە ، بۆ خۆت دەخەڵەتێنی ، بەڵگەت چیە لەسەر بوونی ئەو خودایەی کە لێی دەپاڕێیەوە ئەی بۆ من نایبینم ؟ پیاوە دەشتەکیەکە دەڵێ ( سبحان الله ) قسەیەکی سەیرت کرد ، جا توخوا خوا بەڵگەی دەوێت لەسەر بوونی ، پیاوە خۆبەزلزانەکە دەڵی ئەی چۆن ، هیچ شتێک بەبێ بەڵگە دەبێ ، کابرای دەشتەکی نەخوێندەواری فەقیری خاوەن مەڕ و ماڵات دەڵێ دە سەیرکە ، لەو کاتەدا ( پشقل )[١] یێکی هەڵگرتەوە و وتی توخوا عەقڵ دەیبڕێ بڵێی ئەم پشقلە لەخۆوە دروست بووە و مەڕێک نەبووە کە ئەم پشقلە بکات ، وە ئەو جێ قاچانەی کە دەیبینی لەو بیابانەدا دەکرێ بڵێیت کە لەخۆوە تییدا دروست بووە ، نەخێر ئەو جێ قاچانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کەسێک بەوێدا

---

١) پشقل لە هەندێک ناوچەدا پێی دەڵێن قشپل .

هاتووە ، کابرای کۆلکە خوێندەوار دەڵێ نەخێر ، کابرای دەشتەکیش دەڵێ ئەی توخوا ئەو ئاسمانەی کە هەزاران ئەستێرەی تێدایە و ئەو خۆرەی کە لە کاتێکی دیاری کراودا هەڵدێت و لە کاتێکی دیاریکراوی تردا ئاوا دەبێت و کاتەکەی خۆی لێ تێک ناچێ ، و ئەو دەریا و زەویە و چەندەها شتی تریش دەکرێ بێ خاوەن بن و زاتێک نەبووبێ کە دروستی کردبن ، خۆ نەبینینی تۆ بەڵگەی نەبوونی ئەو خودایە نیە .

## بۆچی خودا نابینم

ئەو پرسیارە لەوانەیە تا ئێستاش هەر کەمێکی مابێت ، بەڵام حەز دەکەم کە ئەو تۆزەش نەهێڵم ، ئەویش بەوەی کە باسی ئەوە بکەین کە سەردەمانی زوو و کۆمەڵێکی ئێستاش لە خەڵکی وایان دەزانی کە تەنها ئەم ئەستێرەیە و چەند دانەیەکی تری دیاری کراو هەن لەم بوونەوەرەدا و ئیتر

هیچی تر نیە ، بەڵام دوای گەڕان و لێکۆڵینەوە بۆیان دەرکەوت کە زیاتر لە ٢٠٠ بلیۆن ئەستێرە و گەلە ئەستێرەی تر هەن لەم گەردوونەدا ، دەی دەکرێ ، ئەوەی نەیبینیوە بڵێ نیە .

بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی بابەکە و تێگەیشتنێکی زۆرتر ئەم چیرۆکە باس دەکەین ، کە مرۆڤ تێدەگەیەنێت کە بۆچی خودا نابینێت :

قوتابیەک دەچێت بۆلای مامۆستاکەی و سڵاوی لێدەکات و هەواڵی یەکتری دەپرسن و قوتابیەکە بە مامۆستاکەی دەڵێ مامۆستا گیان پرسیارێکم لەلا دروست بووە و حەزدەکەم بیپرسم لە بەڕێزتان ، بەڵکو بتوانی وەڵامم بدەیەوە ، مامۆستاش دەڵی فەرموو پرسیارەکەت بکە کوڕم ، قوتابیەکەش دەڵێت مامۆستا ئەگەر خودا هەیە بۆ مرۆڤەکان نایبینن ؟ مامۆستاش کەمێک بیردەکاتەوە و دواتر پێی

دەڵێت کوڕم بڕۆ و بەیانی وەرە ، بەڵام وەرە بۆ نزیک ڕووبارەکە من لەوێ چاوەڕوانت دەبم ، پشتیوان بەخودا وەڵامی پرسیارەکەت دەدەمەوە ، کاتێک بەیانی دادێت و قوتابی بەڕێ دەکەوێت بۆ لای مامۆستا لە نزیک ڕووبارەکە ، کاتێک دەڕوات دەبینێت مامۆستا خەریکی هەڵکەندنی چاڵێکە لە شوێنێکی زۆر نزیک لە ڕووبارەکە ، و قوتابییەکە سڵاو دەکات و کەمیک سەیری مامۆستا دەکات و دواتر خۆی پێناگیرێت و دەپرسێت مامۆستا خێرە ... ئەوە خەریکی چیت ؟ مامۆستاش دەڵێ کوڕم پەلە مەکە و وەرە یارمەتیم بدە با زوو لێبینەوە ، قوتابییەکەش یارمەتی مامۆستا دەدات و چاڵێکی بچووک دەکەنەوە ، پاش تەواو بوونی چاڵەکە قوتابییەکە چاوەڕونی وەڵامەکەی دەکات لە مامۆستا ، بەڵام مامۆستا دەڵێ کوڕم وەرە یارمەتیم بدە با ئەو ئاوەی ڕووبارەکە بکەینە ناو ئەم چاڵەی

کە دروستمان کردووە ، قوتابیەکە سەری سوڕدەمێنێت لەو قسەیەی مامۆستا و دەڵێت مامۆستا ئاخر چۆن ئەو چاڵە بچووکە ئاوی ئەو ڕووبارە گەورەیەی تێدا جێ دەبێتەوە ، ئەو چاڵە سنورێکی هەیە و لە سنوری خۆی زیاتر جێی نابێتەوە تێیدا ، مامۆستاش ئامانجی خۆی پێکا و پێی دەڵێت ئەی کوڕی شیرینم تۆش چۆن دەتوانی بەو چاوە سنوردارانەتەوە کە سنورێکی دیاری کراوی هەیە ، خوای گەورەی پی ببینیت ؟ چاوی تۆ وەک ئەو چاڵە وایە و خودای گەورە سنورێکی بۆ داناوە کە تا ئەو سنورە بڕدەکات و لەوە زیاتر بڕناکات و نابینێت .

حیکمەتی ئەوەش کە مرۆڤەکان ناتوانن خودای گەورە ببینن ئەوەیە کە توانایان نیە کە بیبینن ، واتە توانای ئەوەیان پێنەدراوە ، هەروەک هەموان دەزانین کاتێک کە پێغەمبەر موسا ( سەلامی خوای لێبێت ) داوای لە خودا

کرد کە خۆی پیێ نیشان بدات ، خودای پەروەردگاریش فەرمووی کە بەرگەی بینینی من ناگریت ، بەڵکو سەیری ئەو چیایە بکە ، کاتێک خودای گەورە خۆی نیشانی چیایەکەدا ، چیاکە کەوتە لەرزین و لەرینەوە ، و پێغەمبەر موساش لە حەسرەتدا بورایەوە .

## پرسیاری سێیەم

### دەی وا باوەڕیشمان کرد کە خودایەك هەیە

### و ئێمە و ئەم جیهانەشی دروست کردوە ،

### ئەی خۆی کێ دروستی کردووە ؟

ئەمەش یەکێکی ترە لە پرسیارە بێ ماناکانی بێباوەڕان ، کە دەتوانم بڵێم کە ئێستا زۆرترین پرسیار دەکرێت ئەم پرسیارەیە ، کە وا من باوەڕم هێنا کە خودایەک هەیە کە دروستکاری هەموو شتێکی دروست کراوە ، ئەی خۆی کێ دروستی کردووە ؟

ئێمەیش دەڵێین خودا ، لە کەس نەبووە و کەسیشی لێنابێت ، ئەگەر وتی چۆن بڕوات پێ بکەم ، بەڵگەم بۆ بێنە ، ئەوکات دەڵێین :

باشە ( نعوذ باللّٰه ) وا ئێمە بڕیارماندا کە خودا لە لایەن کەسێکی ترەوە دروست کرابێت ، لێرەدا بە قایل بوونمان بەم وەڵامە دەرگای هەزار پرسیاری ترمان لێدەکرێتەوە بەبێ وەڵام ، چونکە کە تۆ دەڵێیت خواش دروست کراوە لەلایەن کەسێکی ترەوە یان لەلایەن شتێکی ترەوە ، ئەی نابێت بزانم ئەوی تر کێ دروستی کردووە و هاتووەتە بوون ، وا وتت کە ئەویش یەکێکی تر دروستی کردووە ، ئەی دوایی ئەو ، ئەی دوای ئەو ، ئەی نابێ ئەم پرسیارە کۆتایی بێت و خاڵێک هەبێت کە کۆتا خاڵ بێت و ئێمە بگەینە نەتیجە ، دەی بزانە قایل بوونت بە بوونی خودا ئەم هەموو کێشەیەت لێ دوردەخاتەوە و هیلاک نابیت لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی کە دەڵێت ( ئەی دوای ئەو کێ دروستیکرد ؟ )

# ئەی ئەگەر ئینکاری کرد

ئەگەر هەر بەردەوام بوو و قایل نەبوو ئەوا تۆش ئەم پرسیارەی ئاراستە بکە و بڵێ ئەگەر تۆ وەڵامی ئەم پرسیارەی منت دایەوە ئەوکات ئەوا منیش جوابی تۆ دەدەمەوە :

**پرسیارەکە** : هەموو دونیا دەزانن و شتێکی حاشا هەڵنەگرە کە هەموو تاریکیەک لەم جیهانەدا پێویستی بە ڕووناکی یان ڕۆشنایی هەیە بۆ ئەوەی کە ڕۆشنی بکاتەوە ، ئەی بۆ کەسێک نیە پێم بڵێت ڕووناکی یان ڕۆشنایی بەچی ڕۆشن دەبێتەوە ؟

من وا دەزانم بە سەرنجدانمان لەم پرسیارە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەم پرسیارەی ئەوان چەندە نابەجێ و نەگونجاوە ، چونکە ئەوە دەگونجێت کە سیفەتێک بەسەر شتێکدا نەگونجێت تۆ بەزۆر بیگونجێنیت تێیدا ، دەی

ئەمەش وایە خوا دروستکاری بێ دروستکارە .

## سیفاتەکانی خوای گەورە

دوو سیفات هەن لە خوای گەورەدا کە لە هیچ شتێکی تردا نیە ، ئەویش ئەمانەن :

یەکەم : بە ڕووداوێکی مێژووی تێتان دەگەیەنم ، دەڵێن لەو سەردەمانەی کە بەرامبەرکێیەکی توند لە نێوان زاناکانی موعتەزیلە و جگە لەواندا ڕوویدا و لە ئەنجامدا کەوتنە دەست بەسەرکردن و زیندانی کردنی زانا موعتەزیلییەکان ، بەڵام کاتێک لەلایەن زۆرێک لە بێ باوەڕەکانەوە پرسیاری ئەوەیان لێ دەکرا کە ( ئایا خودا دەتوانێت خودایەکی تر دروست بکات ؟ ) ئەمانیش وەڵامێکی گونجاویان پێ نەبوو بۆیان ، بۆیە هەندێکیان دەڵێن ( بڵێی زانا مەعتەزیلەییەکان نەتوانن جوابی ئەم پرسیارە بدەنەوە ، چونکە ئەوان لە عەقڵدا زۆر زیرەکن ، با بانگیان بکەین ) بۆیە بەگوییان دەکەن و

دەچن بەریان بدەن ، کاتێک بەریان دەدەن و دەیانبەن بۆ لای ئەو کەسانەی کە پرسیارەکانیان کردووە ، و دیسان هەمان پرسیار دەکەنەوە و ئەمیش جواب دەداتەوە و دەڵێت بەڵێ دەتوانێت ، بەڵام پێویستە ئەوەش بزانی کە ( ئەوەی تۆ دەیڵێیت نابێت بە خوا ، بەڵکو ئەویش دروست کراوێکە لەلایەن خواوە ، چونکە ئەو سیفەتەی کە لە خوادا هەیە ، ئەوەیە کە دروستکاری بێ دروستکار بێت ) .

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە یەکەم سیفاتێک کە لە خودادا هەبیت و لە غەیری خوادا نەبێت ( دروستکاری بێ دروستکارە ) واتە نابێت کە دروستکراوبێت .

دووەم : یەکێکی تر لەو سیفاتانەی کە لە خوادا هەیە و لە غەیری خوادا نیە ، ئەوەیە کە هەرچی شت هەیە لە دونیادا قابیلی بوون و نەبوونە ، واتە هەر مرۆڤێک کە هەیە لەم دونیایەدا پێشتر بوونی نەبووە ، بەڵام دواتر هاتووەتە دونیاوە ،

لەمەوە ئەوە هەست پێ دەکەین کە ئەمانە وجودیان نەبووە بەڵام دواتر هاتوونەتە وجود ، بۆیە دروست کراون ، بەڵام ئەگەر پێچەوانەی ئەم قسەیە وەربگرین ئاوای لێدێت کە هەر زاتێک قابیلی بوون بوو بەڵام قابیلی نەبوون نەبوو ، ئەوا ئەو زاتە خودایە ، چونکە خودا ئەزەلیە و هەمیشە و هەردەم بووە و دەبێت .

ئینجا دەبێت ئەوەش بزانین کە هەر شتێک دروست کرا مەرج نیە هەموو سیفاتی دروستکارەکەی تێدابێت ، گریمان کە وتووێژێک لە نێوان موبایل و دروستکاری موبایلەکەدا[١] ڕوودەدات بەم شێوەیەی خوارەوە :

موبایل : ئەرێ کاکە ئەوە تۆ کێی .

---

١) لە وتارێکی دکتۆر عبدالواحیددا ( خوی گەورە پایەداری بکات ) دەرم هێناوە بە کەمێک دەست کاریەوە .

خودا بوونی هەیە ؟ ئەی بۆ نایبینم ؟ ئەی ئەو کێ دروستی کردووە ؟

خاوەنەکەی : من ئەو کەسەم کە تۆم دروست کردووە .

موبایل : ئەوە تۆش وەک من شەحن وەردەگری .

خاوەنەکەی : کورە بابە شەحنی چی من ئەگەر کارەبام لێدەن دەمرم .

موبایل : وەڵڵا سەیرە ئەی بەچی دەژیت .

خاوەنەکەی : وەڵڵا بە ئاو دەژیم .

موبایل : یانی بووخەنە ناو ئاوەوە ناسوتێیت .

خاوەنەکەی : کاکە تۆ موبایلیت و منیش ئینسانم .

موبایل : یانی چی وەڵڵا سەیرە ، ئەی کاکە ئەم بەرنامانە تۆ لە مندا دات ناون ، کەچی هەندێک جار دەیسڕیتەوە و هەندێک جاریش فۆڕماتم دەکەیت .

خاوەنەکەی : کاکە ئەوە ئیشی خۆمە ئیشی تۆ نیە ، من تۆم دروست کردووە ، من پرسیار لە تۆدەکەم نەک تۆ پرسیار لەمن بکەیت .

نموونەی بەرز بۆ خودا ئەم مەسەلەیەش هەر وایە ، کە خوا دروستکارە و دەفەرموویێت دروستکارم نیە ، کەواتە لەو سیفەتەدا هاوبەش نین ، یان کۆمەڵێک پرسیاری تر دەکەن کە بۆچی خوا مرۆڤی دروست کردووە و دەی مرێنێت ، ئەی بۆچی تۆش هەندێک بەرنامە لەناو موبایلەکەدا دادەنێیت و دواتر کە تاقەتت نەما لێی دەیسڕیتەوە و چەندان پرسیاری بێ مانای تر کە دەیکەن .

## ئایا ئەم گەردوونە ئەزەلی‌یە

یەکێکی‌تر لەو قسە و بیر و باوەڕە پوچانە کە هەیە دەربارەی گەردوون ئەوەیە کە ئەم گەردوونە هەر هەبووە و کەسێک یان زاتیک نەبووە کە دروستی کردبێت و کۆتایی نایەت ، بەکورتیەکەی دەڵێن ئەزەلی‌یە و هەتا هەتایە دەبێت ، ئەوەتا ئەمەی من دەیڵێم ( برتراند ڕاسڵ ) فەیلەسوفی ئینگلیزی جەختی لەسەر دەکاتەوە بە گوتەی خۆی کە

دەڵێت : ( گەردوون هەر هەبووە و هەر دەمێنێت ، ئەمە هەموو شتێکە ) دەی با من هیچ نەڵێم ، بەڵکو جێی بێڵم بۆ زاناکانی خۆیان ، بزانین چی دەڵێن دەربارەی ئەم بابەتە : ئەگەر تەماشایەکی یاسای دووەمی داینامیکی گەرمی بکەین کە دەڵێت : ( ئەو وزەیەی لە گەردووندا بەکاردەهێنرێت بەردەوام لە کەمبووندایە ) جا ئەگەر ئەو وزەیە لە کەمبووندا بێت ئەوا ڕۆژێک دێت کە تەواو ببێت .

لەو لێکۆڵینەوانەی کە هەردوو زانا ( ئەلیکساندەر فریدمان و جۆرج لۆمیتەر ) کردیان لەسەر گەردوون بۆیان دەرکەوت کە گەردوون دەکشێت و وەک خۆی نەماوەتەوە ، هەرچەندە ئەم لێکۆڵینەوانە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەوە دەردەخەن کە گەردوون سەرەتایەکی دیاریکراوی هەیە ، وە لەم دواییانەدا سێ گەردوونناس کە ( ئافرین بۆرد و ئالان گوث و ئەلیکساندەر ڤیلنکین ) ئەوەیان سەلماند کە ( هەر

گەردوونێک بە درێژایی مێژوو کشابێت ، ناکرێت کە ئەزەلی بێت ، بە پێچەوانەوە دەبێ سەرەتایەکی هەبێت ) .

وە زانای بەناوبانگی ئیسلامی ( کندی ) بە بیرۆکەیەکی نایاب سەلماندی کە ئەم جیهانە ئەزەلی نیە ، ئەمەش بیرۆکەکەیەتی ( با واش دانێین کە ئەم بوونەوەر و جیهانە ئەزەلی و دوا نەهاتووە ، من یەم بەشێکی کەمی دواهاتووی لێ دەکەمەوە ، دەی ئەگەر دیسان بەشە کەمەکەی بخەیتەوە سەر کە دوایی دێت ، ئێستا چی لێ بەسەر دێت ؟ دڵنیابە کە دوایی دێت ، چونکە بەشەکەمەکە دوایی هاتووە ، بیخەیتە سەر بەشە زۆرەکە کە ئێمە بە دوایی هاتوو حسابی ناکەین ، ئەو کات هەردووکیان بەسەر یەکەوە دوایی دێت ) .

وە هەروەها ( ئیدوارد لوثر ) سەرۆکی بەشی زیندەزانی لە زانکۆی ( سان فرانسیسکۆ ) دەڵێت : ( باوەڕبوون بە

خودایەک کە دێرین و بێ سەرەتایە ، هیچ گرانترنیە لە بڕوابوون بە دێرینی و بێ سەرەتایی ئەم بوونەوەرە کە بێ بڕواکان باوەڕیان پێیەتی ، وە یاسای دووەمی داینامیکی گەرمی ئەو بڕوایەی بە درۆخستووەتەوە و سەلماندوویەتی کە ئەم بوونەوەرە سەرەتای بووە و کۆتایشی پێیەت ، ئەمەش بوونی خودا دەسەلمینێ ، چونکە هەرشتێ سەرەتای هەبوبێت و لە ماوەیەکی دیاری کراودا هاتبێتە کایەوە ، ئەبێ کە داهێنەرێکی هەبێت ، چونکە لە خۆیەوە دەستی پێنەکردووە و خۆیشی خۆی ناهێنێتە کایەوە ، بەڵکو دەبێ کە داهێنەرێکی هەبێت ، دیارە ئەویش ( الله ) یە ) .

کەواتە ئێستا بۆمان دەرکەوت ئەو بیر و بۆچونانە زۆر هەڵەیە کە دەربارەی ئەزەلی بوون و هەتا هەتایە مانەوەی زەوی قسە دەکەن ، بۆیە دەبێت سەرەتایەکی هەبێت کە دروست کرابێت و کۆتاییەکیشی هەبێت .

وە ئەگەر تەماشایەکی ئەو قسەیەی فەیلەسوفە ئینگلیزیەکە ( برتراند ڕاسڵ ) بکەیت ئەوا بەڵگەیەکە بۆ ئەو قسەیەی کە ئەوان باوەڕی پێ ناکەن ، ئەویش بەوەی کە ئەوان دەڵێن کە ئەم بوونەوەرە و ئەم جیهانە دێرین و ئەزەلیە ، بەڵام هەر خۆیان دەڵێن کە ئێمە باوەڕمان بە شتێکی ئەزەلی نیە کە خودایە ، چونکە ناگونجێت کە شتێک لە خۆوە دروست بووبێت و دروستکاری نەبێت .

دەی ئێستا تێم گەیەنن کە بەگوێی کام قسەتان بکەم ، ئەوەی کە دەڵێن هیچ شتێک نیە کە ئەزەلی بێت ، یان ئەوەی کە دەڵێن ئەم بوونەوەرە ئەزەلیە .

# کەی ژیان دەستی پێکردووە لە زەویدا

هەندێک لە مادییەکان واتە بێ بڕواکان باوەڕیان وایە کە ئەم زیندەوەرانەی کە لەسەر زەویدا دەژین لە تەنها خانەیەکەوە هاتووە و دواتر گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆوە دیوە و تا وای لێ هاتووە کە ئەم هەموو جۆرە زیندەوەرەی لێ جیا ببێتەوە و دواتر بەم شێوەیەی لێ هاتووە کەوا ئێستا دەبینین ، پوختەی قسان ئەوەیە لێرەدا کە بێ بڕواکان دان بەوەدا نەنێن کە ئەم زیندەوەرانەش دروست کراون ، بەڵکو دەیانەوێت بڵێن ئەزەلین و هەر هەبوون .

جا بابێین ئەم قسەیەی ئەوان بخەینە بەر نەشتەرگەری عەقڵی مرۆڤێکی کامڵەوە ، بێ باوەڕەکانناڵێن کە باوەڕناکەی خوا دروستکاری نەبێت ، ئەی بۆ پێم ناڵێن ئەی بێ باوەڕەکان ، ئەو خانەیەی سەرتا کە زیندەوەری لێ دروست بووە کێ دروستی کردووە ، خۆ ناشێت بڵێن

لەخۆیەوە دروست بووە ، چونکە ئەگەر وا بڵێین ئەوە قسەکەی پێشوتان دەخەنەوە بەدرۆدا ، کە وتتان باوەڕ بە شتێکی ئەزەلی ناکەین .



لە کۆتایدا هیوادارم کە ببێتە مایەی سود بینینی ئەو کەسانەی کە بەدوای بەڵگەی جواندا دەگەڕان و ئەوانەش کە کەمێک گومانیان هەبوو ، وە داواش لە خودا دەکەم ئەو گومانە نابەجێیانە لە دڵی هەموو کەسێکدا لاببات و ببنە بەندەیەکی ڕاستگۆی پەروەردگاریان .

